

# رابەری
# مرۆڤایەتی

مافی لەچاپدانەوەی پارێزراوە بۆ
# نوسینگەی تەفسیر


ناوی پەرتوک: رابەری مروڤایەتی

نـــاوی هۆنەر: بروا محەممەدی

بڵاوكردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر

تـــاینلی بەرگ: نەوزاد كۆیی

بەرگ : لمین مخلص

نۆرە و سالی چاپ: یـەكـەم ١٤٢٧ك- ٢٠٠٦ز

تیـــــراژ: ٢٠٠٠ دانـــە

لەكتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی ( ٢٠٩
سالی٢٠٠٦ دراوەتێ






چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

# رابەری مرۆڤایەتی

هۆنراوەی

بڕوا محەمەدی

١٤٢٧ هەولێر ٢٠٠٦

پێشکەش بێت:-

- بەشوێنکەوتوانی دین و ڕێگەو سوننەتی ڕابەری مرۆڤایەتی { محمد } (ﷺ).

- بەوکەسانەی هەنگاوی کۆڵنەدەرانە دەهاوێن بۆ گەیشتن و دیتنەوەی ڕێی ڕاست.

- بەوکەسانەی ناهەمواری و ناجوانی بەرامبەر باوەڕو ئاکارو پیرۆزییەکانی میللەتی کورد و گەلانی دی ئاکەن.

- بەگۆرانی بێژو سروودبێژانی پابەند بە ئایینی ئیسلامی پیرۆز.

- بەمندالآنی پاك و بێ گوناح، بەمێردمندالآن و هەرزەکارانی میللەت و ئوممەتەکەم.

- بەدایکم ، بەبراوخوشکەکانم ، بەهاوسەرەکەم بەکچەکانم و کوڕەکانم.

بروا موحەممەدی

هەولێر کوردستان

جومعە ١٧/صەفەر /١٤٢٧ ك     ١٧/٢/٢٠٠٦ز

* * *

پێشەکی:

بۆ خوێنەرانی خوێندەوار، ئەو ( پەنجاوسێ ) شیعرەی کە لە دووتوێی ئەم پەرتووکەدا بەرچاوتان دەکەوێت. ئەمەل و وەفایەکە بۆ پێغەمبەرەکەم. جێبەجێ کردنی ئەرکێکە، کە خودای کاربەجێ بەهرەداری کردووم بەتوانستی شیعری. شانازی بوونمە، بەموسڵمانێتی و شوێنکەوتنی پێغەمبەر و عەبدایەتیم بۆ خودای ( صمد ). هاندانێکە، بۆکۆمەڵان و خەڵکانی موسڵمان. دواندنێکی زانستیانە و واقیانەی کەسانێکی ناحاڵی و نەشارەزا، بەئادەمیزادێك و پێغەمبەرێك و ڕەسولێکی وەك پێغەمبەر ﴿ محمد ﴾ (ﷺ)و دین و ڕێبازەکەیەتی. جالەم ڕوانگەیەوە هیوادارم توانیبێتم ڕاژەیەك بەئەدەبی ئیسلامی بکەم .

داوا:

١- لە خودای بێ هاوتا داوا دەکەم ئەم بەرهەمەم بکاتە سڕینەوەی کەمێك لە گوناهەکانم و لێم گیرا بکات .

٢- بەخوازم بیسەران و خوێنەران و خوێندەوارانی کورد لێی سودمەندبن

# یادی پێغەمبەرمانە

یادی پێغەمبەرمانە
پێشەوا و سەروەرمانە
(سیرەی)ڕێنموویی پێیە
پێشڕەو هاندەرمانە

* * *

پێغەمبەری ئاکارە
ڕابەری بڕوادارە
ڕەوشتمان، فێردەکاتن
چاکسازی کاروبارە

* * *

مرۆڤێکی هۆشیارە
هەر، بەندەی (پەروەردگار)ە
سوننەت و ڕێگەی (نوور)ە
لە لامان، ڕوون و دیارە

* * *

ئەو ڕێبازەی هێناوە
پاک وچاک و تەواوە
شەریعەی پەروەردگارە
خۆی بەندەیە و نێردراوە

* * *

هەموو ساڵێ، لە یادی
بە، خۆشەویستی و شادی
پەیمان نوو، دەکەینەوە
بە ئەوپەڕی ئازادی

* * *

ئەو کەسەی ئەو ڕێبەرە
باوەڕکات، پێغەمبەرە
شوێن ڕێبازی بکەوێت
بە ڕاستی تێکۆشەرە

* * *

ئا گەلۆ بۆ پێشەوە
بە کردەوەو پەیڕەوە
دەبێ لە، یادمان بژێ
ئەو، پێشەواو پێشڕەوە

# ئەی خۆشەویست

ئەی نێردراو و بەندەی چاکی ( خودای تاك و میهرەبان )
روناکی ڕێگەت پەخش کرد نەتهێشت سوڵتەی تاغوتان

* * *

بە، گیان و ماڵ و ئەمرو ڕا، خەباتت کرد پشت بە(خوا)
بۆ، پەیڕەوی حوکمی قورئان، هەنگاوت نا بۆ گشت لا

* * *

ژینی نازارو کۆچەریت، ئەزموون و گۆڕانکاری بوو
بۆ چەسپاندنی حوکمی (خوا) و نەهێشتنی زۆرداری بوو

* * *

ڕاستی و دڵپاکی و نەترسیت، کێشەکانی ڕاڤە، کرد
بەزەیی و ئارامی ئەوتۆی، بۆ هەموو دەڤەرێك، برد

* * *

هەموو کاتێك لە یادی تۆ بەوپەڕی سەرفرازی
گروتینی، ڕێنموونی، بۆ ئێمە، بە، شانازی

* * *

بەڵێنی بڕوای ئیسلامیت پێدەدەین، تا ماین لە ژین
خەبات بکەین بەسەرو ماڵ سەربازی ڕێی (خودا) بین

تێبینی نێری (٥ و ٦) لەگۆڤاری (ڕابەر) بڵاوکرایەتەوە

# محمد

( محمـــد ) پێغەمبـــەری مـــەزنمان
( محمـــد ) پێشـــەوای ڕێـــی ڕۆیشـــنمان
( محمـــد ) تێکشـــکێنی دوژمنمـــان
( محمـــد ) ڕێنمـــایی ســـەرنجمان
( محمـــد ) ڕەحمـــەتی بـــۆ گشـــت جیهـــان

* * *

( محمـــد ) ئـــەی ڕێبـــەری خۆشەویســـت
( محمـــد ) ئـــەی مرۆڤـــی خۆنەویســـت
( محمـــد ) خـــاوەنی هەڵوێســـت و ویســـت
( محمـــد ) ئـــەی پێشـــڕەوەکەی پێویســـت
( محمـــد ) ڕابـــەری ڕێگـــەی ژیـــان

* * *

( محمـــد ) بـــەڕێزو خـــوێن شـــیرینی
( محمـــد ) ڕەوشـــت بـــەرزی زەمینـــی
( محمـــد ) ڕاژەکـــاری ڕێـــی دینـــی
( محمـــد ) نـــوژداری گشـــت برینـــی
( محمـــد ) ئـــەی فەرمانـــدەری هـــەموان

( محمد ) تا بمینین له رێی تۆ
( محمد ) دەکەوینە شوێن پێی تۆ
( محمد ) تا نەفەرمووی نەڵێی تۆ
( محمد ) هەنگاو نارێین، بە بێی تۆ
( محمد ) رێی تۆیە، چارە و دەرمان

* * *

( محمد ) پشت بە (خوا) تێدەکۆشین
( محمد ) بە ماڵ و گیانی شیرین
( محمد ) بۆ سەقام گیربوونی دین
( محمد ) ئێمە دەژین و دەمرین
( محمد ) باشترین، بەندەی (رەحمان) (جل جلال)

## نێردراوی خوا

ئەی موحەممەد نێردراوی خوا
ئەی هێنەری (نور) و (هودا)

* * *

فەرمانی خوات جێ بەجێ کرد
بە، کردەوە کارت، پێکرد

* * *

لە پێناوی بانگی خوادا
ئەو پەڕی توانات پیشاندا

* * *

حوکمی ئیسلامیت، دامەزراند
دڵەکانت، بە (نور) هەژاند

* * *

بە نیگای پاکی خوداوە
دادگەری تۆ دەنگی داوە

* * *

فەسادی و زۆرداری ئەما
سولتەی تاغوتەکان ڕەما

* * *

لە سایەی ڕێگات گەڕاوە
ئازادی و ماف بۆ چەوساوە

* * *

پەروەردەت کرد ڕۆلەی بێگەرد
لە خوا ترس و چەلەنگ و مەرد

* * *

کە گیان فیداو ئامادەیە
قوربانی ئەم ئیسلامەیە

* * *

بەڵێ ﴿ محمد ﴾ پێشەوای
باشترین فەرماندەی دونیای

* * *

شوێنی ڕێگاکەت دەکەوم
دڵنیامە سەردەکەوم

# ئەی پێشەوا

ئەی پێغەمبەر، ئەی پێشەوا
ئەی ڕێبەری ڕاستی و ڕەوا

* * *

بە، بوونی تۆ دونیای تاری
ڕووناک، بۆوە، گوندو شاری

* * *

ڕاستگۆ و دەستپاکی سەردەم بووی
دەستی ئاشتبوونی سەرجەم بووی

* * *

بە نەرمی و ڕێکی و لێزانی
تێکۆشای بۆ ئاوەدانی

* * *

دەستی بەزەییت، درێژ کرد
دڵی زۆر کەست، ساڕێژ کرد

* * *

ڕابەری ئاشتی و جیهاد بووی
بۆ چەوساوان تۆ فریاد بووی

* * *

بـــۆ، چەســـپانی حـــوکمی خـــوایی
ڕابـــــــووی دژی بـــــــەرەڵلایی

* * *

کـــــوفرو زۆردارانــــت ڕووخانـــــد
ئـــــازادی و دادگـــــەریت، چەســـــپاند

* * *

بـــە ڕێنـــوێنی خـــوای بەخشـــندە
گفـــــت و کـــــردارت، پەســـــندە

* * *

ئـــەوەی وەهـــات، هێنـــا، کایـــە
شـــانازی‌بێن لـــەم دونیایـــە

* * *

پـــەیمان بـــە گیـــان پێغەمبـــەرم
هـــەر، لـــە، ڕێـــی تـــۆ، تێکۆشـــەرم

* * *

تـــا..بمێـــنم لـــەم دونیایـــە
شوێنکەوتەی تـــۆم ڕێـــم ڕێـــی خوایـــە

لەژمارە ٧ ی ڕۆژنامەی (ڕاپەڕین) بڵاوکراوەتەوە بەبۆنەی یادی (لەدایکبوونی پێغەمبەر)

# ئەی پێغەمبەر

ئـــەی پێغەمبـــەر، خۆشەویســـتم، ڕابـــەری مرۆڤایـــەتی
هانـــدەری چـــاکەو دادگـــەری و ســـۆزی پـــاك و مەردایـــەتی

* * *

ڕۆژی لـــە دایـــك بـــوونی تـــۆ، ڕۆژی پڕشـــنگداری شـــەو بـــوو
مـــژدەی شـــادی و هێمنـــی بـــوو، ڕەوانـــەوەی خـــەم و خـــەو، بـــوو

* * *

پێش پێغەمبەریت، ئاسراو بووی بە ئاکاری ڕاستگۆی دەستپاك
لـــە ئەشـــكەوتی حیرانـــدا، بیركردنـــەوەت لـــە( خـــودای تـــاك )

* * *

پرشـــنگی بانگەوازەكـــەت، دەســـتی فریـــا و بـــەزەیی بـــوو
دەســـتگرتنی ئـــادەمی بـــوو، بـــۆ ســـەر ڕێگـــەی ڕزگـــاری و خـــوو

* * *

بـــۆ خێـــزان و كـــەس و كـــارت، بـــۆ هاوڕێیـــانی جـــوان
بـــۆ هـــەر یـــەكێك بوویســـتایە، باشـــترین ڕەفتـــارت دەنـــوان

* * *

برسی بوون و ئازارەکان، نەیانتوانی کۆڵت پێدەن
مێژووی ساغی ڕووداوەکان، بەڵگەن، شاهێدیت بۆ، دەدەن

* * *

بە پشتیوانی( خوای گەورە ) درێت، بە دوورگەی کوفردا
لە وولاتی ستەم لێکراو، ڕۆڵی بت پەرستی نەما

* * *

بە ڕووناکی پەیامی ( خوا )دونیای نووستووت، لە خەو، هەستاند
بانگەواز و برایەتی و جیهادت لە دڵان چەسپاند

* * *

فەرمانت دا بە گۆی دونیا ئیسلام بەرنامەی ژیانە
هەر کەسێك شوێنی بکەوێ، سەرکەوتووی هەر دوو جیهانە

# پێشەواکەم

بە بیرێکی ورد و قوول
شوێنکەوتەی تۆم ئەی ( ڕەسول )

* * *

ئەی ( نەبی ) ئەی ( پێغەمبەر )
پێشەوامی تێکۆشەر

* * *

پێشڕەوی تاجی سەری
پەیامبەری سەروەری

* * *

ئیمامی پێغەمبەران
خۆشەویستی ڕەنجدەران

* * *

ڕەحمەتی هەموو دونیا
ڕابەرەکەم پێشەوا

( محمد ) راستگۆی دەستپاک
خاوەن هەڵس وکەوتی چاک

* * *

لە خۆم خۆشترم دەوێ
گوێ دەگرم چی دەفەرموێ

لەژمارە ١٢ ی مانگنامەی ، دەنگی گەرمیان ، بلاوکرایەتەوە

# ئەی ﴿ محمد ﴾

ئـــەی ﴿ محمـــد ﴾ پێغەمبـــەر
دروودی ( خـــودات ) لەســـــەر

*　*　*

پێشـــــــەوای پێغەمبـــــــەران
رێبـــــــەری تێکۆشـــــــــەران

*　*　*

تـــۆ، پێشـــەنگی دادگـــەری
راســـــت و رەواو ســـــەروەری

*　*　*

هێمـــای بـــەرزی و ئـــارامی
پێغەمبـــــەری ئیســـــلامی

سایەی مرۆڤێتی یە
ڕاستی خۆشەویستی یە

* * *

مێژووت خاوێن و ڕوونە
شادی دڵ و دەرووتە

* * *

جێی متمانە و ئاواتی
سیمای ئاشتی و خەباتی

* * *

شایانتە، شوێنت، کەوین
بە پێی ڕێگەت، سەرکەوتن

* * *

تا بە، شانازی دەکەین
بە خەلآتی ( حوسنەیەین )

لەژمارە ۱۲۰ )ی ڕۆژنامەی ( کۆمەڵ ) بڵاوکرایەتەوە

# ئەی ڕێبەرم

ئەی ( محمد ) ئەی ڕێبەرم
لە ڕێگەی تۆ، تێکۆشەرم

* * *

خۆشم دەوێی لە خۆم، زێتر
نییە، لە ڕێگەی تۆ، چێتر

* * *

گوێڕایەڵ و پەیڕەوکەرم
موسڵمان و بڕوادارم

* * *

پێشەوای ئادەمیزادی
ڕاست و ڕەوانو ئاشتی و دادی

* * *

لە، سەرووی ڕەوشتی بەرزی
هێمای ئازادی و سەربەرزی

* * *

ڕەحمەتی جیهانەکانی
ڕێنمایی وانەکانی

* * *

بەڵێ ﴿ محمد ﴾ پێشەوام
بە، ویستی ( خوا ) زۆر بە تەمام

* * *

بە بەر شەفاعەت کەوم
بەرەو بەهەشت، سەربکەوم

لەژمارە ٧ ی گۆڤاری ( ڕابوون ) بڵاوکرایەتەوە

# ڕابەری مرۆڤایەتی

ڕێبەرەکـــەی مرۆڤێتـــی، ئـــەی ( موحەمەدەلموســـتەفا )
ڕێگـــەی تۆیـــە ( نـــور ) و( فورقـــان ) ســـەروەرییەو ڕێـــزو وەفـــا

* * *

خۆشەویســـتی دەوروبـــەرو شـــکۆو ســـەنگینی میللـــەت بـــووی
سەرهەڵدانی ( هودا ) و( هیوا )ی نێو، دۆخی تاری و زیللەت بووی

* * *

لەوکاتـــەوەی پەیامەکـــەت لـــە بـــۆ ڕزگـــاربوون ڕاگەیانـــد
خـــزم و خێـــڵ و تاغوتـــەکان، زوڵمیـــان بەرامبـــەرت نوانـــد

* * *

کەچـــی ئـــەتۆ ئارامـــت گـــرت تـــەنها بـــە پشـــتیوانی ( خـــوا )
بـــە لێبـــووردەیی جوانـــت بـــە پێـــی ( نیگـــا ) هـــەنگاوت، نـــا

* * *

تـــاکو ئـــاڵای کـــوفرو نیفـــاق لـــە نێـــو، بـــەرو دڵان گـــۆڕا
ســـولتەی چەواشـــەو لاملـــی ســـەری شـــۆڕ بـــوو و بـــەزی و دۆڕا

* * *

ئەوجا ( نـور ) هـات نـوری ژیـان وڵاتـی ڕووناک کـردەوە
ڕەش و ڕووت و کزمەڵگاکـەی بـۆ نێـو حەقیقـەت بـردەوە

* * *

پاشـان ژیـان لـە بـۆ مـەردووم واتـای ئاشـکراو ڕوون بـۆوە
بوونـە ڕێـزدارو سـەربەرز بـە هـۆی ڕابـەری وەک تـۆوە

* * *

ئێسـتاش ئێمـە وەک موسـڵمان پابەنـدی ڕێبـازی پـاکتین
جیهاد دەکەین لەم ڕێیەدا تەنها بەندی ( خـودای تاکتین )

تێبینی/ لەژمارە ٤٨٢ ی ڕۆژنامەی ( یەکگرتوو ) بڵاوکرایەوە

# رابەری خۆشەویست

ئـــەی ( محمـــــد ) خۆشەویســـــت
ئـــەوەی خـــەڵك لـــە تـــۆی ویســـت

* * *

( نـــوور ) و ( ژیـــن ) و ( ســـــەلامە )
ڕاســــــــتی و دوا پەیامــــــــە

* * *

ڕاســـتگۆ و دەســـتپاکی ژینـــی
تکارکــــــاری ڤــــــەژینی

* * *

ڕێبـــــازی تـــــۆ پـــــیرۆزە
ڕێگـــەی گشـــت گـــەل و هـــۆزە

* * *

وتـــــەکانت لەجێیـــــــە
ئـــەمری ( خـــوا )ی کاریەجێیـــە

ئازادی نەوەکانی
ڕێنمای دڵەکانی

* * *

ژیاننامەت خاوێنە
مزگێنی و شادی هێنە

* * *

پەیامت شانازییە
ڕێگەی سەرفرازییە

* * *

بەڵێ ڕابەر خۆشەویست
بەندەی پاک و خوداویست

* * *

خۆشەویستیم لەتۆیە
پەیڕەوی ڕێگەی تۆیە

# ئەی ڕەسول

ئـــەی ڕەســـولی خۆشەویســـت
تــۆ ســوودت بــۆ گشــتمان ویســت

* * *

هێنـــــات ڕوونــــاکی ژیـــــان
قورئـــــانی پـــیرۆزی گیـــــان

* * *

حەقیقـــــــەتت ڕاگەیانـــــــد
شـــادیت بـــــە دڵان گەیانـــد

* * *

خـــاوەن هەڵوێســـتی ڕوون بـــووی
ڕێنمـــــوونی دەروون بـــــووی

* * *

حکوومـــــــەتت دامەزرانـــــــد
خـــــەڵکانی دونیـــــات هەژانـــــد

* * *

دادگـــــەری ژینـــــی تـــــۆ بـــــوو
ڕاســـــتەقینەو ڕاســـــتگۆ بـــــوو

* * *

مێـــــژووی پاکیـــــت تۆمـــــار کـــــرد
مرۆڤێتیـــــــت ڕزگـــــــار کـــــرد

* * *

جـــا چـــۆن نـــەڵێم ســـەرکردەم
مـــن کـــە لـــەم گەلـــە کـــوردەم

* * *

تـــــۆ شـــــایانی پێشـــــەوای
کـــــە خـــــاوەن ڕێگـــــەی ڕەوای

* * *

تـــــۆ ڕەســـــوڵی ڕەحمـــــەتی
بـــۆ گشـــت جیهـــان نیعمـــەتی

# ڕابەرەکەم

من کە خاوەن ڕابەرێکم
ڕەسوڵێکی خوداوەندە
کامەرانم سەرکەوتووم پێی
خاوەن ڕێنوێنی پەسەندە

* * *

من شوێنکەوتووی ڕابەرێکم
شتی هەر وا نەفەرمووە
بەڵکو بە پێی ( نیگا )ی ئاسمان
وتەی پێویستی فەرمووە

* * *

ڕابەرەکەم ڕابەرێکە
بە ڕاستگۆی دەستپاک ناسراوە
بۆ سەرتاپای مرۆڤایەتی
لە بۆ ڕەحمەت هەناردراوە

* * *

دین و ڕێگەو ڕێبازەکەی
ئاینی پاکی ئیسلامە
ئەم دینە ( خوا ) پێی ڕازییە
دینی ئازادی و سەلامە

*     *     *

بــــۆ مێــــژووی مرۆڤایــــەتی
لـــە لای ( خـــودا ) دوا دینـــە
ڕابەرەکـــــەم پێشـــــەوایتی
ئـــاییني دونیـــاو ڤەژینـــە

*     *     *

ئـــەو ڕابـــەرەش ( محمـــد ) ە
ئـا..لــە ، خــۆم خۆشــترم، دەوێ
بەشـــانازی شـــوێنکەوتوویمە
دڵـــم بــە ڕێگـــەی دەســـرەوێ

# چاکترین بەندە

ئێمە خاوەن پێغەمبەری
کۆتایی ڕۆژگاری ژینین
شوێنکەوتەی ڕێگەو ڕێبازی
دوا پێغەمبەر و دینین

* * *

ڕێبەری مرۆڤایەتی
ڕەحمەتی هەموو دونیایە
دوا پەیامی هێناوە
( ڕەسول ) و ( بەندە )ی خودایە

* * *

ئێمە بەوپەڕی شانازی
لە خۆمان خۆشترمان دەوێ
شوێن سوننە و ڕێگەی دەکەوین
دڵ و دەروونمان دەسرەوێ

* * *

ڕەسوڵ مزگێنی بەخشە
دەنگی ڕزگار بوونەوەیە
ئامێزی سۆز و ڕەحمەت و
هێمای زیندووبوونەوەیە

ئـــا " بـــەڵێ " ئـــەو، پێغەمبـــەرە
( موحەممـــەد )ی ڕاســـتگۆ و پاکـــە
بـــۆ، ژینـــی مـــرۆڤ، نێـــردراوە
چـاکترین، بەنـــدەی ( خـــوای تاکـــە )

# ڕێگای پێغەمبەر

هەستن ڕابن ئەی خەڵکینە. شوێن پێغەمبەر کەون
بەرەو ڕێگای سەرفیرازی هەنگاو بنێن سەرکەون

* * *

دەی سەرکەون دەی بەخێربێن بەرەو ڕێبازی پیرۆز
ڕێبازی هەموو میللەتان بە گشت چین و توێژو هۆز

* * *

گەر تێکۆشین گەر تێبگەن لە ڕێگەی ئەو ڕابەرە
جا ئازادە مزاد لەو ڕێیەدا دەزانیت تێکۆشەرە

* * *

ڕێگەی ئەو پێغەمبەرەیە ڕەحمەت و خۆشەویستی
بۆ جیهانەکانی ژیان پێویستی‌یە، پێویستی

* * *

ئاڕاستەی ئەو پێغەمبەرە نیگای ( خودای ڕەحمانە )
خۆراکی ( ڕوح ) و ( جەستەیە ) وتەی ڕاستی ژیانە

* * *

ئەو کەسەی شوێنکەوتەی ڕێی بێ بە ڕاستی دەباتەوە
( خوا ) لە دونیاو قیامەتدا پاداشتی دەداتەوە

# پێشەوای ژیان

( محمد )ە سەروەرە
دلسۆز و تێکۆشەرە
بە فەرمانی خودایە
( ڕەسول ) و تێکۆشەرە

* * *

بە ڕاستی پێشەوایە
بەندەی پاکی خودایە
ڕەحمەت و بەزەیی یە
بۆ ئەم هەموو دونیایە

* * *

خاوەن چاکترین خووە
( خوا ) هەڵیبژاردووە
لەم ژیانی دونیادا
کەس وەکو ئەو نەبووە

* * *

کەواتە با بەندە بین
بەندەی ئەو ( خواوەند )ە بین
کە ( موحەممەد )ی کردە
پێشەوای دونیا و قەژین

# ڕەحمەتی جیهانەکان

موحەممەدمان، خۆشدەوێ
پێغەمبەری خودایە
خاوەن، کۆتا، پەیامە
ڕێنموونی هودایە

* * *

ڕێگەو دینی پیرۆزی
ڕێی جیهانەو گشتی‌یە
پارێزی بوونەوەرە
بێگەردە و سروشتی‌یە

* * *

ئەو، پەیامەی کە، هێنای
کەلامی خوداوەندە
لە، بۆ، مرۆڤایەتی
ڕەحمەت و پاک و ڕەندە

* * *

فێرە، ژیانی، کردین
کە، ژیان، چی، پێویستە
ڕابووین و خۆمان، ناسی
بە، هۆی ئەم، خۆشەویستە

کەواتە لەسەرمانە
شوێن ڕێبازی بکەوین
تا بە ڕووی سپی و خاوێن
بەرەو پاداشت، سەرکەوین

# ڕابەرمان

ڕابەرمان ( موحەممەد )ە، پێشەوایە بۆ مرۆڤ
ڕێنموونی بۆ مرۆڤ دووربوونە، لە ئاخ و ئۆف

* * *

ئەو پەیامەی گەیاندی ڕووناکی گشت دەروونە
ئەوەی شوێنی بکەوێ بە ڕاستی بوونی بوونە

* * *

پەیامێکە شایستەی سروشتی مرۆڤانە
گەشە بە مرۆڤ دەدات، میهری (خوای دلۆڤانە)

* * *

( عەبد ) و(پێغەمبەرێکە)، هەڵبژاردەی ( خودا)یە
ڕەحمەتی ( خودای تاکە ) بۆ خەڵکی ئەم دونیایە

* * *

ئەوەی پێی بوو بۆ مرۆڤ مایەی خۆشی و شادیە
ڕاستە دادە ئاشتییە سەربەرزی و ئازادییە

* * *

لاشــه و دەروونــی مــرۆڤ، پــاك و ئاســوده دەكــات
مــرۆڤ بــۆ چــاكەكاری متــوو و ئــالووده، دەكــات

*     *     *

( پێغەمبــەر ) مرۆڤێكــه شــایانی ڕەهبەریيــه
وتــەو كــارو هەڵوێســتی شــانازی و ســەروەرییه

*     *     *

نیعمەته بۆ گشت جیهان له سەرووی خووی هەورازه
بــۆ ســەرتاپای مرۆڤــان ڕابــەری ڕێــی دەربــازه

*     *     *

ئــەوەی بیكــات، بــه، پێشــڕەو بــەرزی ژیــن و ڤەژینــه
بــه ڕاســتی موســڵمانه ڕاستگۆ و چــاك و بــه دینــه

## موحەممەدملوستەفا

( موحوممەدەلموستەفا )یە پێغەمبەری بەڕێزمان
وتەو کردەوەی بەڕێزی بوویتە ئارامی و هێزمان

* * *

خۆشمان دەوێ تاکو ماوین شوێن ڕێبازی دەکەوین
قوتابی ئەزموونی دادین پشت بە ( خوا ) سەردەکەوین

* * *

پەیامی بەرزو پیرۆزی تاکە ڕێگەی ژیانە
بۆ ژیانی مرۆڤەکان ( هودا ) و ( ژین ) و ( گیانە )

* * *

شوێنکەوتنی ئەو بەڕێزە مایەی کامەرانییە
سوننەت و ڕێگای بێگەردی پاکی و میهرەبانییە

* * *

مەبەستی ( صادقولئەمین ) شەفیعی موسڵمانان
خواپەرستی و عیبادەتە دووربوونە لە تاغوتان

* * *

ڕەحمەتـە، بـۆ گشـت جیهانیـان، چـاکترین بەندەی خوایـە
ڕزگـــاری مرۆڤیتی یــــە، خۆشەویســـتی و هانایـــە

* * *

دین و ڕێگـەی ( موحەممـەد )ە، لـە، لای ( خـودا )پەسندە
بـــۆ، ژیـــانی ئـادەمیزاد، ڕاســـت و پـیرۆزە و ڕەنـــدە

* * *

ئەمـە، فەرمانی، ( خـودا )یـە، دینیش، دینـی ( خـودا ) یـە
( موحومەدولموســـتەفایە ) ڕەســـول و پێشـــەوایە

/ لەژمارە ٢٥ ی بڵاوکراوەی ( دەنگی غەریبان ) بڵاوکرایەوە

# ئەی پێغەمبەرەکەم

ئەی ( موحەممەد ) خۆشم دەوێی تۆ رابەرو پێشەوامی
رەحمەتی جیهانەکانی بەندەو رەسولی خودامی

* * *

بە، نیگای پاکی ئاسمانی، دادگەریت لە دونیا چەسپاند
بە چاکی و داد و ڕاستگۆیی ڕەگی دەسەلاتی هەڵتەکاند

* * *

بە ( صادقولئەمینی ) خۆت، ئالآی ئاکارت، بلند کرد
بۆگشت چین و توێژی مرۆڤ دەستی سۆزو یارمەتیت برد

* * *

بە لێبران و بوێری خەڵکت بانگ کرد بۆ ئازادی
تا بزانن ژیان چی یە شادی نەکەنە ناشادی

* * *

بەڵێ ئەی ( پێغەمبەرەکەم ) ئەی پێشەوای پێغەمەران
خۆشم دەوێی بە پەیڕەوی ڕێی تۆی ڕابەری ڕەنجدەران

* * *

تا لە دونیام بە ملکەچی هەر پشت بە ( خودا ) دەبەستم
ڕێی تۆ دینی ( خودای تاکە ) ڕوونە دڵ و گفت و هەستم

# محمد رسول الله

(محمــــد رســـــول الله ) فێــــره، ژیـــانی کـــردووین
بـه ئامۆژگاری رێکـی بـهرهو رێـی ڕاسـتی بـردووین

* * *

ویستی مرۆڤـهۆشیار بێ ڕاست و خاوێن و ڕەند، بێ
لـه ژیـانی دونیـادا هـەر بەنـدەی ( خواوەنـد ) بـێ

* * *

( محمـد ) بوو پێی فەرمووین تەنها ( خـوا ) بپەرستین
به دڵسـۆزی و دڵپـاکی بـه ئـەرکی خۆمـان هەسـتین

* * *

تـا پیــاوی ڕۆژگـارو ســەربەرزی کـاتی ژیـن بـین
لـه ڕۆژی ژیانــەوەش ڕووخســار سـپی قـەژین بـین

* * *

( محمـــد )یــه نێــردراوی ( خــودای تــاك و دلۆڤـــان )
ڕەحمـــەتی جیهانیانـــه لـــه لای ( خـــوا ) بـــۆ مرۆڤـــان

* * *

ئەو دینەی که هاوردی ( نوور ) و ( ڕوح ) و ( هودایه )
دینـی پـاکی ئیسـلامه تاکـه ڕێگـەی ( خـودا ) یـه

# پێغەمبەر ( موحەممەد ) بوو

پێغەمبەر ( موحەممەد ) بوو، ئیسلامی پێگەیاندین
بۆ ئازادی دڵنیایی ڕێی ژینی تێگەیاندین

* * *

بۆ شادی مرۆڤێتی گەلێك، خەباتی تواند
کاتی تەمەنی دونیای هیچ، کات بە فیڕۆ نەچواند

* * *

پێغەمبەر ( موحەممەد ) بوو بە وتەی چاك نیان
بە یارمەتی ( خوای گەورە ) بوو بە ڕەحمەتی ژیان

* * *

تاکو مرۆڤ وەك مرۆڤ تێکۆشێ و خەبات بکات
بۆ چاکە و پاداشتی خۆی بە ڕێکی هەنگاو ببات

* * *

پێغەمبەر ( موحەممەد ) بوو کوفر و تاغوتی شکاند
بۆ کامەرانی مرۆڤ حکومەتی دامەزراند

* * *

تاكو پەيامى خوايى لە، نێو دڵان جێگیر بێ
مرۆڤ، وەك سروشتى خۆى پاك و هۆشيار و ژير بێ

* * *

پێغەمبەر ( موحەممەد ) بوو پێشەواى پێغەمبەران
ڕێگەو سوننەتى ئەوە ڕێى هۆشمەندو ڕەنجدەران

* * *

ئێستاش ئەو ( پێغەمبەرە ) كە كۆتا پێغەمبەرە
دين و ڕێگەى بێگەردى تاكە دينى بەشەرە

# پێغەمبەری خۆشەویستمان

پێغەمبەری خۆشەویستمان، خۆشمان دەوێی هەموو کات
پشت بە ( خودا )ی جیهانیسان بەردەوامین لە خەبات
بێگومانین لەم دونیایە تەنها ڕێبازی تۆیە
ڕەوشت و کرداری تۆیە چاکسازی دونیا دەکات

* * *

تۆ جێی متمانەی مەردوورم بووی. خەڵکانیشت، جوان کرد
بە ( نوور )ی ( قورئان ) و ( سوننەت ) مرۆت فێرە ژیان کرد
تا ئەوپەڕی توانای خۆت پشت بە ( خوا ) تێکۆشەر بووی
بۆ ڕزگاری مرۆڤەکان ڕووت لە هەموو جیهان کرد

* * *

لە مەدینە پێش هەموو شت مزگەوتێکت دامەزراند
بە وتەی ڕێك و نیانت پەیامێکت ڕاگەیاند
برایەتیت لە نێو هەموو دینداراندا دروست کرد
زوڵم و فەسادیت لە ناو برد خەڵکت لە خەو ڕاچڵەکاند

* * *

بەڵێ بە پشتیوانی ( خوا ) دونیات پوخت و نەخش کرد
پەیامی پیرۆزی پاکت بۆ نێو دڵان پەخش کرد
کۆڵنەدەر بووی لەم ژیانە تێکۆشای بۆ ئازادی
کۆششی تۆ ڕاست و ساغە خەڵکت فێرە کۆشش کرد

تێبینی/ لە ژمارە ٣٢ ی گۆڤاری ( پەیامی ڕاستی ) بڵاوکراوەتەوە

# خۆشەویستی مرۆڤان

خۆشەویستم خۆشم دەوێ‌ خۆشەویستی مرۆڤان
( عەبد ) و ( ڕەسول ) و ( ڕەحمەتی ) (خودای گەورە و دلۆڤان)

* * *

لە سەرووی ئاکاری بەرزی چاکترین بەندەی ( خواوەند )ی
بۆ ژیانی جیهانەکان باشترین مەئوا و سەعەندی

* * *

کاتێک ئەتۆ لە ژیاندا تێدەکۆشای بۆ ئازادی
بۆ ئەوەی گشت مرۆڤەکان خەنی بن بە ڕاستی و شادی

* * *

خەڵکانێکیش. وەکو سەرۆک خەڵکیان فێرە زوڵم دەکرد
بەناوی چاکسازی میللەت هەنگاوی هەوەسیان. دەبرد

* * *

بەڵام ئەتۆ خۆشەویستم ( صادقولئەمینی ) ژیان
پەیام و ڕێنگەت ڕۆشنە بۆ ئازادی لاشە و گیان

* * *

جا تا ماوم خۆشم دەوێ‌ پشت بە( خوای تاک ) تێدەکۆشم
بە سوننەتی گەشانەوەت سەرتاپا خۆم، دادەپۆشم

# پێغەمبەرە

پێغەمبەرە رابەری ئەم دینە پاك و بێگەردەیە
پێشەوای ڕێ و ڕێنموونی ڕاستەقینەی پەروەردەیە

* * *

بەندەو ڕەسولی خودایە(خوا) بە ڕەحمەتی ناردووە
پێغەمبەریش بە، ئەمری (خوا) ڕێی ژینی نیشان کردووە

* * *

پێغەمبەرە، فریاد ڕەسی هەموو کۆمەڵی مرۆڤان
بانگی ڕزگاری و هۆشیاری بۆ نێرو مێ و پیرو لاڤان

* * *

دینی نوور و ڕێی شادییە مرۆڤ براوە و شاد دەکات
لە تەلبەندی هەوەسەکان ڕوح و لاشە ئازاد دەکات

* * *

پێغەمبەرە، پێشەنگەکەی ژینی ئازادی بەشەری
مرۆڤەکان باش فێردەکات بۆ گەیشتن بە سەروەری

* * *

چونکە، دینی ڕێگەی ژینە، خالقی بوون، بۆی داناوە
هەوەسی مرۆڤان نییە چاك و خاوێن و تەواوە

# موحەممەدی ڕاستگۆ

پێغەمبەر و پێشەوامان موحەممەدی ڕاستگۆیە
ڕێنما و پەیامی دینی بۆ ئەو و من و تۆیە

* * *

ڕەحمەتە بۆ جیهانەکان نیعمەتی ئەو ڕەحمانە
بۆ سەرتاپای مرۆڤێتی پێشڕەو و میهرەبانە

* * *

بە ڕەوشتی چاک و جوانی دونیا باران ڕێژ دەکات
بە حیکمەت و چارەی گونجاو زامی ژین سارێژ دەکات

* * *

خۆی لە نێو ژینی تەمەنی بە کردەوە نواندی
ئەوەی چاکە بوو بۆ مرۆڤ وەک ڕۆژی ڕوون سەلماندی

* * *

هەر ڕێگەی ئەو پێشەنگەیە ڕێی دروستی مرۆڤان
شەنگی لاشە و دڵ و ڕوحە دوور لە تالان و کۆڵان

* * *

پــەیام و ڕێــی ئازادییــە چــونکە ڕێگــەی خودایــە
گشــت مــرۆڤ دەخوێنێتــەوە پایــە و جێگــەی تێدایــە

* * *

سەر بڵندو بەرچاو ڕوونین کە پابەندی ئەم ڕێیەین
بە موسڵمان بوون دەنازین هەر بەندەی ئەو خودێیەین

* * *

کــە موحەممــەدی کردۆتــە ڕابــەری ژیــن و ڤــەژین
بە دڵنیایی هەنگاو دەنێین بۆ ڕێی دەمرین و دەژین

# یادی پێغەمبەرمان

دوازدەی رەبیعولئەووەل
پشت بە ( خودای ئەلئەووەل )

* * *

یادی پێغەمبەرمانە
پێشەوا و رابەرمانە

* * *

هەموو سالێك، لە، یادی
بە شانازی بە شادی

* * *

ئەم یادە پیرۆز دەگرین
رێزداری لێوەردەگرین

* * *

چونکە ئەو پێغەمبەرە
کە چاکترین بەشەرە

* * *

سروودی مرۆڤی دەوێ
مرۆڤ بە ڕێی دەسرەوێ

* * *

کەواتە با هەموومان
بە هەڵویست و بە خۆمان

* * *

بەم یادە پەروەردە بین
ئەو مرۆڤە مەردە بین

* * *

ژینمان پەیرەوی ڕێی بێ
چاک و پوخت و لە جێی بێ

# پێغەمبەری هەمووماں

موحەممەدی ڕاست و پاکە، پێغەمبەری هەمووماں
بۆ خۆشی ژین و فەرژینمان بوویتە فێرکاری خۆوماں

* * *

چاکترین مرۆی دونیایە (خوا) شاهیدی بۆ داوە
نێردراوە، لە، لایەن (خودا) هەر، ڕێگەی ئەو، تەواوە

* * *

بە، هەوڵ و خەباتی ڕەوا گۆڕانکاری پەیدا، کرد
لە نێو چین و توێژی گەلان خەڵکی بۆ دین شەیدا کرد

* * *

ویستی بۆ (خوا) تەنها ویستی خەڵك چاك و ئازاد بێت
لە، دونیا و لە، قیامەتدا دەروون خۆش و دڵشاد بێت

* * *

ڕێگە و پەیام و سوننەتی ڕێگای سروشتی ژینە
بۆ، کامەرانی مرۆڤان تاکە ڕێباز و دینە

* * *

ئـەوەی بیناسـێ ئەزانـێ شایسـتەی پێشـەنگی یە
شوێنکەوتووی ڕێبازی ئەوە ڕاستی و چاکی و شەنگی یە

* * *

چونکە کە بوو بە (پێغەمبەر) ڕابوو ڕابوون دروست، کات
لە نێو مێژووی ڕەش و قێزن نووری ڕێی ژین بەدەرخات

* * *

پشت بە ( خودا ) هەنگاوی نا بەرگەی کۆسپەکانی گرت
تاغوتـانی لـە نـاو بـرد و مـافی مرۆڤـی وەرگـرت

* * *

ئـەو جـا باشـە مرۆڤـەکان پـەیڕەوی ڕێبـازی کـەین
بـە وتـە و کـردەوەی پوخـت داوای سـەرفیرازی کـەین

* * *

تـاکو لـە دونیـا سـەربەرز و ڕوو سـپی قیامـەت بـین
لـە ئـەزموونی ئـەم دونیایـە بـراوە و سـەلامەت بـین

# پێشەوای ڕزگاری

ئەو کاتەی ( موحەممەد ) هات، دونیا لە تاریکستان بوو
پیس و تاوانی تاغوتان، لەو پەڕی زوڵم و پەستان بوو

* * *

ڕۆژگارێك بوو لە نێو ڕۆژگار، دونیا، بێ شەرمی پۆشی بوو
عەقڵ و بیرکردنەوەی خەڵك، ژێری نەبوو، بێ هۆشی بوو

* * *

بەڵێ، ئەو کات ( خودای تەنیا ) ( خالق )ی ئەم، بوونەوەرە
( موحەممەد )ی بە ڕەحمەت نارد، بۆ پێشڕەوی ئەم بەشەرە

* * *

تاکو مرۆڤ بێتە نێو ( نور ) تاریکی یەکان وەلا بنێ
بۆ خۆشی خەونێکی دونیا، بۆ خراپە، هەنگاو، نەنێ

* * *

وابوو بە هاتنی ( ئەحمەد ) پاکسازی دونیای گرتەوە
پەیڤی سپی زمانەکان، خۆیان سەلماند بە کردەوە

* * *

سەلماندیان ئەم پەیامە، پاك و تەواو و ژیانە
بۆ سەرتاپای مرۆڤێتی پاکی لاشە و خۆشی گیانە

* * *

کۆتا پەیام و پێغەمبەر، ئا، بەڵێ.. بۆ ئەم، دونیایە
ئیسلام، پەیام و ڕێبازە، موحەممەدیش پێشەوایە

* * *

پێشەوایە بۆ ڕزگاری و سەرفیرازی گشت مرۆڤان
بۆ ئاوەدانی ئەم دونیا و ڕازی بوونی ( خوای دڵۆڤان )

# ڕۆژی لە دایک بوون

ڕۆژی لـــە دایـــک بـــوونی شـــانازی بونـــەوەرە
ڕۆژێکـــی بـــەرزو گـــەورەی پەیـــدابوونی ســـەروەرە

* * *

ســـەرهەڵدانی ڕۆژێـــک بـــوو، کـــە دونیـــا چـــاوەڕوانە
تێـــری و ئـــازادی ڕوویـــدا ئـــەو کـــاتی لـــەم جیهانـــە

* * *

منـــداڵ و ژن و پیـــاو بـــەم ڕەحمەتـــە هـــۆگر بـــوون
بەرامبەر زوڵم و کوشتن پشت بە ( خودا ) خۆگر بوون

* * *

تـاکو وەچـەرخانی جێ بۆ ( مەدینـە ) بـە ڕێ کـەوت
دەســـەڵاتی ئەمینـــدار بـــە چاکســـازی بـــە دەرکـــەوت

* * *

ئەوجا فەتحی دڵ و جێ بۆ گشت لا دەستی پێکرد
بـە دەسـتی خۆشەویسـتی ڕەوشـی خـەڵکانی چێکرد

* * *

بـــەڵێ، ئەمـــە مێـــژووە ڕاســـتی و پـــاکی دیـــارە
مێـــژووی مرۆڤـــی مـــەرد و پیـــاوی بـــڕوادارە

* * *

ئـــەوجا ئـــەوەی مرۆڤـــە مرۆڤـــی موســـڵمانە
دژی چەواشـــەو زوڵمـــی تـــاغوت و زاڵمانـــە

* * *

دەزانـــێ و شـــارەزایە ئـــەم، یـــانە چـــلۆن دەکـــرێ
لـــە تەمـــەنی ژیـــانی دەســـتی خـــۆی پێـــوە دەگـــرێ

م/ لە ژمارە (٢٩) مانگانەی (وەرچەرخان) بڵاوکرایەتەوە.

# پێغەمبەرێت مە

پێغەمبەرێت مە ڕەهبەرا هەمیان
بەندە و ڕەسول ( خودای میهرەبان )

* * *

توی خوشتڤیت مە چاکترین مرۆی
ڕاستگۆ و دەستپاکی دژی گشت درۆی

* * *

سوننەتێت تەیە، ڕوناهیت ژینێ
بۆ خۆشی هەمو نەتەوە و چینێ

* * *

گفتێت تە، ڕاستە گومان تێنینە
بۆ مرۆڤ و جن سەربەرزی و ژینە

* * *

ڤێجا ئەم لەوا سەربازێت ڕێ تەین
بۆ پەیڕەوی ڕێت هێز پەخش دکەین

* * *

بەلكی چاڤا مە ب تە ڕوناهیت
خەلكانیش بە مە بێ ئوّف و ئاهیت

* * *

بەلێ، پێغەمبەر ڕێبازێت تەیە
ڕوو سپی ژین و ڤەژینی مەیە

* * *

تە، ( موحەممەد ) و ( ئەحمەد ) و ( تەها ) ی
ڕێبەری بەها و پاكی و موستەفای

# ڕەحمەتی خوا

( خوایە ) ڕەحمم پێبکەی شوێن ڕەسولەکەت کەوم
بە دروستی هەنگاونێم لە ژیندا پاش نەکەوم

* * *

وام لێکەی بە زارو و دڵ ڕەسولی تۆم خۆشبوێ
پەیڕەوی سوننەتی کەم دڵم زیندوو بێ و نەنوێ

* * *

( خوایە ) کە تۆ هەناردت پێغەمبەری عالەمین
ڕەحمەت بێت بۆ جیهانیان بۆ خەڵکانی ڕووی زەمین

* * *

منیش داوات لێدەکەم بەو ڕەحمەتە هۆگر بم
لەم ژینە کورتەی دونیا، پشت بە ( تۆ ) خۆڕاگر بم

* * *

ئەو پێغەمبەرە بوو ( تۆ ) کردت بە پێشەوای ژین
بۆ ڕزگاری گەلان و هۆز و تیرە و توێژ و چین

* * *

بە کردەوە ڕەحمەت بوو فەرمانی تۆی ڕاگەیاند
ئادەمزادی دڵسۆزی بۆ ئەم ژینە پێگەیاند

* * *

کاتێک، خەڵک لە خەو بوو ئەو لە ڕێی ( تۆ ) بێدار بوو
بۆ چاکسازی ڕەوشەکان ئاگاداری بەشدار بوو

* * *

ئامێزی خۆشەویستی بۆ، گشت لا ئەکردەوە
خاوەن گفت و بەڵێن بوو بە چاکترین کردەوە

* * *

جا تکام وایە ( خوایە ) بەم داوایە شادم کەیت
وەك بەندەیەك یادت کەم تۆش ( ڕەحمانی ) یادم کەیت

* * *

تاکو بە دڵنیایی بزانم کە ئارامم
شوێنکەوتەی موحەممەد و ڕێگەی پاکی ئیسلامم

# کۆتا پێغەمبەر

پێغەمبەر ( موحەممەد )ە چاکترین، مرۆی ژینە
ڕەحمەتی جیهانیانەو کۆتا ڕێبەری دینە

* * *

بە ڕاستگۆیی و دەستپاکی خەڵکی بۆ ( حەق ) ڕاکێشا
تۆوی خۆشەویستی چاند. ڕق و کینەی هەڵکێشا

* * *

کاتێك خەڵکیك برسی بوون، ئەو یەکەمین کەسیان، بوو
بۆ ئارامی دەروون و تەبابوونیان بەسیان بوو

* * *

چونکە بە گفتی نیان هەستەکانی دەبزواند
دڵی خەڵکی بەرەو ( حەق ) بە شانازی دەهەژاند

* * *

لە کاتی دەسەڵاتدا، ڕەحمەتی خۆی پیشاندا
( ئایە )ی ( خوا )ی بەجێگەیاند، خەڵکی بۆ چاکە هاندا

* * *

بارووبۆی خەڵکی دەکرد ئامێزی چەوساوان بوو
دەستی سۆزی نێو هەموو زارۆ و پیرو لاوان بوو

* * *

ئەوجا ئەو پێغەمبەرە کە (صادقولئەمینە)
ڕەحمەتی ئەم جیهانە و تکاکاری قەڕینە

* * *

پێویستە شوێنکەوتەی بین لە خۆمان خۆشتربوێ
وتە و ڕەوشت و کارمان لەگەڵ ڕێبازی بلوێ

# پێشەنگی مرۆڤان

( موحەممەد ) ڕەسولێکە لە بۆ ڕەحمەت نێرراوە
لە لایەن ( خوای ئەڕڕەحمان ) فەرمانی پێکراوە

* * *

عەبدێکە خالقی بوون بۆ مەخلوقی هەڵبژارد
بۆ پێشەنگی مرۆڤان چاکترین بەندەی هەنارد

* * *

پێشڕەوی چاکەکاری و تەواوکاری ڕەوشتە
ڕێگە و سوننەتی بەرزی سروشتی نێو، سروشتە

* * *

مرۆڤەکان وەک مرۆڤ سەیرو تەماشە دەکات
هەموویان ڕوو، لە، خێرو ئاراستەی باشە دەکات

* * *

لەگەڵ خێزان و خزمی چاکە و وەفای بەرپا کرد
خەڵکانی بۆ ژینی ڕێ هۆشیار و بە ئاگا کرد

* * *

تاکو جیهان بزانن ئەوکاتە ژیان ژینە
کە ئیسلام ڕێباز و ڕێ و ئایین و ڕێگە و دینە

* * *

( موحەممەد ) کە هاتووە بۆ ڕابەری گشت خەڵق
بۆ ئەوە لە دوای ئەوە، ببەخشێ، سوود و کەڵک

* * *

چونکە ڕێگەی پیرۆزی ئیسلامە دینی خوایە
مژدەی زیندووبونەوە و سەرفیرازی دونیایە

* * *

ئێمەش دەبێ شوێنکەوتەی پێغەمبەری بەڕێز بین
موسڵمانی دلێرو ئارامگر و بەهێز بین

* * *

پەیڕەو کەین دین و سوننەی کە کۆتا ڕێگەی ژینە
تاکو سەربەرز بژین لەم دونیاو لەو ئەژینە

# موحەممەدی ڕەسول

کاتێ لە ڕەوشی ڕقدا مژدەی لە دایک بوون هات
بەندەیەك ئازادکرا ڕۆژی ئازادی هەڵهات

* * *

وردە وردە ڕەوشەکان.. بەرەو باشە دەگۆڕان
سەرەنجام ( حەق ) بەسەرکەوت تاغوتەکانیش دۆڕان

* * *

جابوو بە خۆشی دڵان ڕووخسارەکان سپی بوون
ئەوەی وێرا ئازاد بێت پەیڕەو کات ڕێی ڕاست و ڕوون

* * *

تا بوو بە دەرکەوتنی ژن و پیاوی دلێر
دەستی شەڕ دامرکاوە و پەرەی سەند دەستانی خێر

* * *

ئا ئەوەی بوو بە مژدە بۆ ئازادی مرۆڤان
( موحەممەدی ڕەسول ) بوو ڕەحمەتی ( خوای دلۆڤان )

* * *

لـە نێـو کۆمەڵگـەی مـرۆڤ، وەرچـەرخانی دامێنـا
مرۆڤـی لـە سـەر ڕێـی ڕاسـت جـوان کـرد و ڕامێنـا

* * *

ئامۆژگـاری عـەقلی کـرد، ئیسـلام ڕێبـازی ژینـە
ئـەو کەسـەی خۆشـی بوێـت بـەرزی ژیـن و فەژینـە

* * *

پەیامێك بوو بۆ خەڵکان تا بە ئاگاو هۆشیار بن
موسـڵمانی پابەنـد و بەنـدەی پـەروەردگار، بـن

# ڕێبازی ڕەسول

پێغەمبەرە چارەسەری زامەکانی ئادەمزاد
ڕووناکی نێودڵەکان و ژیانێکی ساغ و شاد

* * *

ئەو لە بۆ سەرتاپای مرۆڤ، بە ڕەحمەت هەناردراوە
پێشەوای پێغەمبەرانە و پێغەمبەر و نێردراوە

* * *

لەگەڵ عەقڵە ساغەکاندا گفتوگۆ و پەیڤین دەکات
بە کرداری ڕێک و جوان بانگەشەی ئەڤین دەکات

* * *

تاکو کۆمەڵگەی مرۆیی ئارام و ئازاد بین
لە دونیاو لە قیامەتدا ڕووسپی و دڵشاد بین

* * *

ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە موحەممەدی ڕێپاکە
پارێزی سروشتی ژینە هەڵبژاردەی خوای تاکە

* * *

چاکترین بەندەی خودایە و کۆتا ڕەسولە. بۆ ژین
چۆن ڕەحمەتە بۆ ئەم ژینە شەفیعیشە بۆ فەژین

* * *

دەوجا ژن و پیاوی ژیر هەستن ڕابین تێکۆشین
بە ڕێبازی ئەو ڕەسولە خەبات کەین خۆبپۆشین

* * *

بەڵکو بە ڕەحمی (خوای تەنها) بربنەوە بەدەست دێنین
بۆ دەرچوونمان لەم ئەزموونە پەیڵی چاکە دەخوێنین

# بەڕێزترین ئادەمیزاد

چاکترین بەندەی ( خودای تاك ) بەڕێزترین ئادەمزاد
بە فەرمانی ( خوای ئەڕەحمان ) هێنات ڕاستی و ئاشتی و داد

* * *

بووی بە مژدەی ڕێگای مرۆڤ ڕێی ژینت بۆ ڕاگەیاند
بە هەڵسوکەوتی ڕێك و ورد پەیامی خوات تێگەیاند

* * *

مێژووی ژینت چاکەکاری و چرپەی ڕەوشتداری بوو
بۆ ئازادی گشت مرۆڤان دژی گشت زۆرداری بوو

* * *

ئەو پەیامەی کە تۆ هێنات بۆ مرۆڤ سروشتی‌یە
سوودی زیندووبوونی ژینی قازانجێکی گشتی‌یە

* * *

ئەوانەی کە شوێنت کەوتن بە ( ماڵ ) ( گیان ) ئامادەبوون
خاوەن هەڵوێستی مەردانە و خاوەن گفت و وادە بوون

* * *

تــۆ بــووی ویســتت مرۆڤــەکان ســەرکەوتووی ژیانیــان بــن
تــەنها فیــدا و گوێڕایــەڵ و بەنــدەی خــوای جیهانیــان بــن

* * *

تــاکو بــەرز و ســەرکەوتوو، بــن ( خــودا ) لێیــان خــۆش ببــێ
بــە نیعمەتــە تــەبڕاوەکان دڵیــان، شــاد و خــۆش ببــێ

## ( محمد ) ئەی پێغەمبەر

( موحەممـــەد ) ڕەســـوڵ ( خـــودا )
( موحەممـــــەد ) هێنـــەری هـــودا

* * *

تـــۆ بـــووی کاتێـــک هاتیـــە ژیـــان
بـــووی بـــە ڕزگـــاری چەوســـاوان

* * *

ڕاســـتگۆ و دەســـتپاکی وڵات بـــووی
جێگـــەی مزگێنـــی و ئـــاوات بـــووی

* * *

تـــاکو بـــە فـــەرمانی ( خـــوای تـــاک )
بـــە پـــەیام و ڕەوشـــتی پـــاک

* * *

دونیـای نوسـتووت لـە خـەو هەسـتاند
هێـــزی بـــوغز و زولمـــت وەســـتاند

* * *

ڕێـــی ژیانـــت نمـــایش کـــرد
دونیـــات پـــڕ لـــه ئاســـایش کـــرد

* * *

خـــەڵکانت فێرکـــرد فێـــر بـــبن
ئاشـــتیخواز بـــن دوو ڕوو نـــەبن

* * *

تـــاکو لـــه ژێـــر ئـــەم ســـێبەرە
کـــە ڕێگـــەی تـــۆی پێغەمبـــەرە

* * *

خـــەباتی دونیـــا تـــەواو کـــەن
بـــه لێخۆشـــبوونی ( خـــوا ) بگـــەن

# پێشەوای ژیانەکەم

ئەی ( موحەممەد ) پێغەمبەرم پێشەوای ژیانەکەم
نووری پەیامی ڕێی تۆیە هەست و هۆش و گیانەکەم

* * *

بە کردەوە خۆشم دەوێی لە خۆم خۆشتر دەوێی
گوێڕایەڵی سوننەتتم، بەڵێ، تۆ چی، دەفەرموێی

* * *

تۆ بووی ژیانت فێرکردم ڕێی ژیانت نیشاندام
دڵ و لەشم ئارامی گرت بە دینی پاکی ئیسلام

* * *

خۆشم دەوێی شوێنکەوتەتم بە شانازی و دڵخۆشی
تەنها ڕێگەی ڕاستی تۆیە ڕێی ڕاستەقینەی خۆشی

* * *

تۆ ( پێغەمبەری کۆتایی ) ژیانی ئەم جیهانەی
بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی ڕەحمەتی ئەم ژیانەی

* * *

چاكترین هەڵبژێردراوی بۆ ڕابەری مرۆڤان
ڕەحمەتی بە ڕاستی ڕەحمەت بە نەمری ( خوای دڵۆڤان )

* * *

بەڵێ، ( موحەممەد ) ڕابەرم ئەو كەسەی شوێنت كەوێ
لە ژینی دونیا و قیامەت سەربەرزە و سەرنەكەوێ

* * *

كەواتە من چۆن شاد نەبم بە دوای ڕێگەی تۆ كەوم
بە، ڕاستی شاد و دڵنیام بە ڕێی تۆ سەربەكەوم

# ئەی پێغەمبەری خودا

ئـــەی پێغەمبـــەری خـــودا تـــۆ دەرمـــانی دڵانـــی
متمانـــــەی دەروونـــــان و نەهێشـــتنی تلانـــــی

* * *

هـەر بـە پشـتیوانی خـوا ڕاڤـەی کێشـانت، پێیـە
ڕێنوێنیـت دینـی خوایـە چـاکترین چـارە و ڕێیـە

* * *

تـۆ بـە پـاکی ژیـاوی ڕێـی پاکیشـت پـەخش کـرد
ژیانی ئەم دونیایـەت بـە کاری چاك نـەخش کـرد

* * *

هـانی شـوێنکەوتووانت دا بـەدڵو لـەش جـوان بـن
بـە هـەڵس و کـەوتی بـەجێ لێبووردە و میهرەبـان بـن

* * *

شـەو و ڕۆژت خـەبات بـوو بـۆ چاکسـازی مرۆڤـان
وشـەی پاکـت دەگـەیانـد لـە ڕێـی خـودای دڵۆڤـان

* * *

بەڵکو خەڵك هۆشیار بێ داوای مافی خۆی بکات
بۆ گۆرانکاری و چاکبوون خەبات، کار هەوڵ بدات

* * *

بەڵێ، پێغەمبەری خوا تۆ باشترین ڕابەری
کۆتا پەیامت هێنا کە کۆتا پێغەمبەری

* * *

بۆ ئەوەی خەڵکان بەگشت بەم پەیامە ئازاد بن
بە لەش خاوێن و ڕێك و بە دڵ و دەروون شاد بن

# ئەی کۆتا ڕەسول

ئەی کۆتا ڕەسول ژین ڕەحمەتی خودای تەنها
گەڕێنەرەوەی داد و مایەی پەرشت و بەها

* * *

بەو پەیامەی بۆت دەهات خەڵکت لە خەو هەڵدەستاند
بەرپەری خۆشەویستی فەرمانی خوات دەگەیاند

* * *

ئاشتی و ئەڤینت پێبوو بۆ ژن و پیاو و منداڵ
بەرگریت کرد لە مافی کچانی زیندە بەچاڵ

* * *

بە گوێرەی ئایەتی خوا نەخشەی پەروەردەت داڕشت
بۆ تێکەیشتن لە ژین چواشەکاریت نەهێشت

* * *

بانگی مرۆڤانت کرد بۆ ئەوەی ئازاد بین
بە ئاکاری ئانەمی سەرکەوتوو و دڵشاد بین

* * *

تا وەك مرۆڤ بزانن دینی خوای ئێلۆڤانە
کۆتا دین و شیاوە ڕزگاری مرۆڤانە

* * *

کەواتە تۆ ڕەحمەتی ڕەسوڵی خودای مەزن
ئەوانەی شوێنت کەون، هەرگیز لە ژین نابەزن

* * *

چونکە ئەو دینەی هێنات، نیگای خوای پەروەردگارە
سایەی ڕەحمەتی ڕاستی گشت مافی گیاندارە

# ڕابەری ئەم جیهانە

موحەممەد ( رسول الله ) یە، ڕابەری ئەم جیهانە
دین و سوننەت و ڕێگەیتی مایەی بەرزی و ژیانە

* * *

خوا بە ڕەحمەتی ناردووە ڕەحمەتە بۆ جیهانیان
ڕێنموونییە بۆ ڕاستی بۆ ڕێزداری ژیانیان

* * *

ڕەسولێکە بە پەیامی پێشەنگی ڕزگاری‌یە
پەیڕەوکاری چاکەکاری و خێرخوازی و هاوکاری‌یە

* * *

بۆ ڕێی ڕاستی مرۆڤەکان تاکە ڕابەری ژینە
چاکترین بەندەی خودایە کۆتا ڕەسولی دینە

* * *

مرۆڤێکە ڕاستگۆ و دەستپاک لە ( قورئان ) باسکراوە
لە لایەن ( خودای بێ هاوتا ) بۆ ئاسمان گاسکراوە

* * *

تا ئەو ڕۆژەی (خوا) پێیداوە بە سەر دونیا پەخش کات
مرۆڤ شاد و برلوە بێت بە بەهەشتی ( خوا ) بگات

# ڕێی سەرکەوتن

وەرە مرۆڤایەتی ڕاستی و ڕەوا بخوێنە
لەم ژینەی ژیانەدا تەنها چاکە بنوێنە

* * *

چونکە چاکەیە مایەی سەرفیرازی قەوارەت
هۆشیاری و سەرکەوتنە بە سەر نەفسی ئەمارەت

* * *

بزانە تەنها ڕێیەک کە پێی بەرز و سەرکەویت
ئارام و ڕوو، سپی بیت ئەدزرێیت و نەکەویت

* * *

ئەو ڕێیەی پێغەمبەرە کە ئاینی ئیسلامە
بۆ سەرجەم مرۆڤێتی تەواوترین پەیامە

* * *

ئە هۆشکە تا کەی دەژی دژی بوونی جوانت؟
ناگەڕێیتەوە بۆ لای ڕێگای خوای میهرەبانت

* * *

( خوا ) ڕەسوولی بۆ ناردووی کە دوا پێغەمبەرە
بۆ خۆشی ژین و دینت ڕابەرو چارەسەرە

# با پێغەمبەر ڕابەرمان بێ

با هەموومان پێشکەوین بۆ پێشەوە
پەیڕەوی کەین دین و ڕێبازی پێشەوا
چونکە هیچ لەم ڕێبازە باشتر نییە
کە مرۆڤ لە سەری ڕێک بن پێکەوە

* * *

با هەمووەمان وەک مرۆڤ ڕەفتار بکەین
لە، ڕۆڵی ژینمان، هەستکەین و تێبگەین
بزانین لە ژێر ئالآی پێغەمبەرە
کە بۆ بەرزی هەوڵی ڕێک و پێک، بدەین

* * *

با هەمووەمان تا دەژین لەم دونیایە
کە دونیا دروستکراوی خودایە
پێغەمبەرو ڕابەرمان - محمد - بێت
کە تەنها ڕێی ( ئەو )ە ڕاست و ڕەوایە

* * *

با هەمووەمان بزانین ئەو ڕابەرە
لەلایەن ( خوا ) ڕەسول و پێغەمبەرە
بۆیە ڕاستە، ڕێگەی ڕاستە. شایانە
کە ببێت بە ڕێبەری ئەم بەشەرە

# پەیامی پێغەمبەر

کۆتـــا ، پێغەمبــەری ژینــە، خۆشەویســتی هەموومانــە
ڕەحمەتە بۆ گشت جیهانیان، ڕەحمەتی خوای میهرەبانە

* * *

بەنــدە و ڕەســوڵی خودایــە، بەرنامــەی بۆ خەڵکان هـانی
تاکو لە ناپاشی دوور بن هۆگر بن بە پاکی و جوانی

* * *

لەو کاتەیدا بوو بە ( نبی ) ڕابوو، دەیویست خەڵك ڕابی
بـۆ قەشـەنگی ئـادەمیزاد، مـرۆی هانـدا بـۆ ئـازادی

* * *

لەو پێناوە کەشەنگی چێشت ئارامگر بوو هەنگاوی برد
بەوپـەڕی سۆز و دڵسۆزی ڕووخساری دونیـای ڕۆناك کـرد

* * *

جەنگـەکانی ئـەخوازراو و بـۆ دادگـەری بـەرپا دەبــوون
لـە سـێبەری هـەنگاوەکان، ڕاسـتاڵی و ئـارامی هـەبوون

* * *

لاپـەڕەکانی مێـــژووی ئـەو، پەنـد و ڕاسـتی پیشـان دەدا
چـین و توێـژی مـەردومانی بـەرەو چـاکخوازی هـان دەدا

* * *

بـەڵێ، ئەمـە پێغەمبـەرە پـەیامی خـوای بۆمـان هێنـا
بە ڕاستگۆیی و پاکی و پوختی ئـەرکی شـانی بـەجێهێنا

* * *

بـەڵکو خـەڵکان بـە هۆشیاری لـە ژینـی خۆیـان ڕامێـنن
بە فـەرمانی خـوا، بزاڵاً، کەن ئـەرکی شـانیان بـەجێ بێـنن

# ڕەسولی خوا

ڕەسولی خوای دڵۆڤان
ڕەحمەتە بۆ مرۆڤان
پەیامێکی هێناوە
ڕاست و پاک و تەواوە

* * *

ڕەسولێکە، ئەمینە
ڕابەری دونیاو دینە
ئەرکی خۆی بەجێگەیاند
خەڵکانی نووستووی هەژاند

* * *

بەیارمەتی خوا توانی
بە پەیڤی نەرم و جوانی
خەڵکان بە ( حەق ) ئاشنا، کات
بەرەو بەهەشتیان ببات

* * *

بەڵێ ڕەسولی خوایە
بانگی ڕزگاری لایە
ئەوەی شوێنی بکەوێ
لە ژینی سەرنەکەوێ

دوایـــــــــین پێغەمبـــــــــەرە
دڵســــــوزی گشـــــت بەشـــــەرە
خـــــاوەن دەســـــتپاکی و خـــــووە
چـــــاکترین پێشـــــەنگ بـــــووە

# تەنها رێیەك

تەنها رێیەك رێی ژیان بێ كە مرۆڤ ئاسوودە بكات
بە گەشەنگی و خۆشەویستی هانی هزری خەڵكان بدات
رێگە و سوننەی ( موحەممەد )ە كە پێغەمبەری خودایە
لەم رێیەدا ئادەمیزاد بە شكۆ و ئاواتی دەگات

* * *

تەنها رێیەك كە شایان بێ مرۆڤەكان شوێنی كەون
مایەی خێر و جوانی بێ، لە ژیانیان پێی سەركەون
ئەو پەیامە جوانەیە كە موحەممەد بۆی نێردراوە
بەو پەیامە مرۆڤەكان رێك و خاوێن و پتەون

* * *

تەنها رێیەك سروشتی بێت ئاشنای ناخی ئادەمزاد بێت
هاندەری چاكە و چاكەخوازی و برایەتی و ئاشتی و داد بێت
گوتە و كردەوەو هەڵوێستی، كۆتا پێغەمبەری خوایە
كە سوننەتە بۆ مرۆڤی ژیر گەر بیەوێ چاك و شاد بێت

# پێغەمبەر پێی ناساندین

لاالــــــه الا الله پێغەمبـــــــەر پێــــــی ئاســـــــاندین
محمـــــــد رســــــول الله ڕاســـــتی پێڕاگەیانــــــدین

* * *

مرۆڤێکی ڕاستگۆ بوو ( خوا ) کردی بە ( پێغەمبەر )
بوو بە، ڕەحمەتی ژین و ( شەفیعی ) ڕۆژی (مەحشەر )

* * *

بـــەو پـــەڕی خۆشەویســـتی فـــەرمانی دا، فەرمانـــە
ئەو کەســە قــازانج دەکــات خواویســت و موسـڵمانە

* * *

بە ڕێکوپێکترین خوو هەڵسوکەوتی پێشکەش، کرد
خەڵکانی هۆشیار کردو دونیای ڕونـاک و گەش، کـرد

* * *

تـاکو تـەنها هـەر ( الله ) لـە نێو دڵان جێگیر بێ
مـــرۆڤ بـــراوەی ژینـــی و ئـــازاد و ڕۆشـــنبیر بـــێ

# موحەممەدی دڵسۆز

( موحەممەد )ە، ئادەمی و مەخلوقی ( خوای دلۆڤان )
لە، سەرووی خووی بڵند و چاکترینی مرۆڤان

* * *

بەندەیەکی دڵسۆزەو دوا، ڕەسوڵی خوایە
بۆ، سەرجەم، مرۆڤێتی ڕێی ژیانی هێنایە

* * *

تاکو، خەڵکان، هۆشمەند، بن، شوێن، ئاینی بکەون
لەم، ژینە و لەو، ژیاندا، سەربەرز و سەربکەون

* * *

ئەمە، فەرمانی ( خوا ) بوو، ( موحەممەد ) پەیڕەوی کرد
بە، خۆشەویستی و ڕێکی ڕابەری و پێشڕەوی کرد

* * *

بە، پەروەردەی سروشتی، دڵی مرۆڤی گۆڕی
بۆ، ژینێکی پاك و شاد، ڕەوشی خەڵکانی نۆڕی

* * *

مرۆڤی فێرکرد، بڵێ، تەنها ( الله ) خودامە
( محمد ) پێغەمبەرمە و ئیسلام، دین و ڕێگامە

# دوا پێغەمبەر پێغەمبەرمانە

دوا پێغەمبەر پێغەمبەرمانە
پێ نیشاندەرو تاجی سەرمانە

* * *

دین و سوننەتی مایەی شادییە
داد و ڕوناکی و ڕێی ئازادییە

* * *

پەیامی جوانی قەشەنگی ژینە
سەربەرزی دونیا و دەرچووی ڤەژینە

* * *

ڕێگەی بۆ ژیان ڕێک و دروستە
پۆپی زانست و پڕ تەندروستە

* * *

بە کرداری جوان مرۆی جوان کرد
فێرە ڕەوشتی ڕێکی ژیان کرد

* * *

کەواتە ئێمە وەکو بڕوادار
موحەممەدینە و بەندەی پەروەردگار

## ( موحەممەد )ە

( موحەممەد )ە پێغەمبەر و رابەری ژیانەکەم
نیشاندەری ڕێگەی ڕاستی ئارامی گیانەکەم
بە دڵ لە خۆم خۆشتر دەوێ شوێن سوننەتی دەکەوم
بێگومانم لەم دونیایە و لەو ژینیش سەردەکەوم

* * *

کاتێك گوێم لە ناوی دەبێ هەست بە وەرچەرخان دەکەم
بە ماڵ و گیان بە شانازی خۆم بۆ ڕێی تەرخان دەکەم
ئەمە ئەرکی موسڵمانە، چۆن دەبێ وا نەبێ؟
ئەوەی بڕوای بە (خودایە ) دەبێ، بڕوای بەو هەبێ

* * *

کۆچ و هیجرەتی پیرۆزی، وێنەی سپی مێژووە
مایەی چاکسازی ژیانی چین و توێژەکان، بووە
هەنگاوەکان، سەلماندیان، ژین، بەو کۆچە جوانە
سایەی ئارامی دڵان و حەسانەوەی هەموانە

* * *

بەڵێ ( موحەممەد ) رابەرمە، پەیڕەوی ڕێگای دەکەم
خۆم بە قوربانی پەیام و پاکژی نیگای دەکەم
( عەبد ) و ( ڕەسول )ی خودایە، چاکترین پێشەوایە
تەماشا... ڕووناکی پێیە، ڕاست و پاك و ڕەوایە

## با ( موحەممەد ) باش بناسین

گوێتـــان لێـــبێ، ئـــەی خـــەڵكانی ئـــەم دونیایـــه
( موحەممــــــەد )ە پێغەمبــــــەر و پێشـــــەوایه
خـــودای تـــەنها بـــە( ڕەســـول )ی هـــەناردووه
بـــۆ مـــەخلوقان هـــەر ڕەحمـــەت و ڕەحمـــەت بـــووه

* * *

تەماشـــا كـــەن وردبنـــەوه ( دیـــن )ی ڕێیـــه
بـــۆ مرۆڤـــێ هەســـت پێبكـــات ڕاســـتی پێیـــه
چـــاكترین بەنـــده و نێـــرراوه ( خـــوا ) دەفـــەرمووێ
پەیامەكـــەی لەگـــەڵ مـــرۆڤ تـــەواو دەلـــووێ

* * *

ئـــەوا مێـــژوو ( ســـیره)ی ژینـــی ڕوون و ڕێكـــه
پزگاركـــاری دڵ و هـــــزری گشـــت كەلێكـــه
بـــه هەڵوێســـتی نـــەرم و پـــاكی خـــەڵكان ڕابـــوون
لـــه تـــاریكی وازیـــان هێنـــا هـــاتن چـــابوون

* * *

كەچـــی خـــەڵكێك لـــه ئاســـت ڕابـــەر ناڕێـــك دەدوێ
لـــه ئـــازادی تێناگـــاتن قســـان دەجـــوێ
ئەمـــه پیشـــەی بـــێ شـــەرمان و كۆنانەیـــه
وەرگرتنـــی شاباشـــێك و چـــەند عانەیـــه

* * *

بەڵێ، ئەحمەد ڕابەرمانە، فێرمانی کرد
بە باشبوون و بە جوون نەدان فەرمانی کرد
پێیگەیاندین پەیامەکەی سەردەکەوێت
بە فووی دەمی ناحەزانی ( دین ) ناکەوێت

* * *

کەواتە با ئەم ڕابەرە باش بناسین
گەر مرۆڤین ژیرمان هەیە پاك و خاسین
چونکە ئەوەی نەفسی بیخوات ڕوو ڕەش دەبێ
لە بەرزی دونیا و قیامەت بێ بەش دەبێ

# شوێن پێغەمبەر بکەوە

زارۆکێت من موسلمانی شوێن پێغەمبەری کەوە
دینا پێغەمبەرێت مەیە ڕاست و پاک و بتەوە

* * *

تو گوهدارێت بابێت خو بە بزانە قازانج دەکەیت
ئەڤە ڕێیەکا درستە گەر تۆ باشی تێبگەیت

* * *

دینا موحەممەدا ڕاستبێژ دینی گشت مرۆڤانە
خۆشیا ژین و ڤەژینییە (نور)ی خوای دلۆڤانە

* * *

ڕەحمەتە بۆ هەمی خەلکان ئازادی دابین دەکات
ڕەوشا مرۆڤی هەمی گاڤ چاک و پوخت و ڕێک دەخات

* * *

بلا هەر گاڤ هەمی بێژین (موحەممەد) پێشەنگمانە
نیعمەتا خودێیە بۆ مە گەشەی دەنگ و ڕەنگمانە

* * *

زارۆکێت من ئەز بۆ تەمە ڕێی پێغەمبەر ڕێگایە
سەرکەفتنا ژین و دینە ڕەزامەندی خودایە

*** ***

# پێرست